# چایەکەی جەنابیان

ئیسماعیل خالید گەلاڵی

ئەو رۆژی پۆستی بەڕێوەبەری دەزگاکەمانی وەرگرت، هەر لە سبەینێوە یەکێکی بەهەڵەداوان نارد، حازربن کۆبوونەوەیان پێدەکەم. هەر یەکەو مەستی خەیاڵێك خوشینە هۆڵی کۆبوونەوە، کلۆمی باولی بیری هەر یەکەمانت ترازاندبا، عاجباتیت دەدیتن، من حەجمانم لێبڕابوو. داخوا لێدەگەڕێ لەشوێنەکەی خۆمدا بمێنمەوە، یا وەلم دەکا. ئەوی بەرامبەرم فیسکەی سمێڵانی دەهات، دیاربوو قەولی دابوو، لەگەڵ خشپەی پێی جەنابیانڕا لەجێوە دەرپەڕێ و لەدەرگەوە تا ئەو دیو مێزە پانوپۆڕەکە ئیکلامی بۆ بکێشێ و شانی بۆ داوەشێنێ و تۆزی لێهەڵتەکێنێ. بەمەش نەك هەر کورسیەکەی خۆی دەپاراست، رەنگبوو یەکدوو شەقاوانیش هەڵکشێ. ئەوەی پاڵیشم، ناوە ناوە دەیڕوانیە تیلمە کاغەزەکەی دەستی کە کۆمەڵێك زاراوەو قسەی قەڵەو قەڵەوی تێدا نووسیبوون، تا لەخزمەت جەنابیان بەکاریان بێنێ و بەخێرهاتنێکی شاعیرانەی بکات. ئەوی پەڕگەش نەیدەزانی فایلە رووتەکەی دەستی چلێبکاو لە کوێی راکا، لوولی دەداو دەیخستە بن کەوشی، ئۆقرەی نەدەگرت، دەریدەهێناو لەسەر مێزەکەی بەردەمی رایدەخست و دوو دەستی پێدا دەهێناو لووسلووس بە سنگیەوە دەنووساند. نەمدەزانی چی تێدایە، بەلاّم دڵنیا بووم کۆمەڵێك شتی نووسیوون و بەر لەوەی کەس بیانبینێ دەیەوێ تەسلیم بەدەستی موبارەکی جەنابیانی بکا.

ئەو هەموو نقوجقە یەکجاری ئۆقرەی لێهەڵگرتبووم، ئەوەم بەخەیاڵدا دەهات هەر کە جەنابیان گەیشتە دەرگەی ژوورێ، نەیکەمە نامەردی و هەتا هێزم تێدایە خۆم لە پەنجەرەکەوە هەڵدەمە دەرێ و تا پێم دەکرێ غار دەم، غار ئەمان غار، هیچ بارەبانێك تۆزم نەشکێنێ. لەو خەیالاّنەدا بووم، مام کانەبی بەڕەنگێکی هەڵبزرکاوو پەشێو سەری لێوە ژوور خستین:

ـ جەماعەت دەلێن مامەستا تەشریفی گەیشتە دەرکەی عەوشێ.

کاکە دەتگوت دەردی ئەجەلێی پێنیشاندام، نەخۆم بە پێوە رادەگرت، نە لەسەر کورسیەکە دەحەوامەوە، نەمدەزانی نەدەمرم، نە لەخۆم دەڕیم، پشیم هەڵمابوو تکتك ئارەقە بەلاجانگمدا دەهاتە خوارێ. کە تەپەی لەدەرکەی وەهێنا، هێندە ئەستوور نەبام دەپسام، رۆح لەجێیەکی قایم بوو، نەهاتە دەرێ. چمان لێوەژوورکەوت ،قوتۆشێکی تەڕپۆش، کورتە بنەیەکی لەڕ، لموز بڵندو لامل داچوڵقاو، چەنەگەی یەك بست لەسینگی دوور راگرتبوو، چاویلکەکەی شۆڕببۆوە سەر لوتکەی لوتە باریك و درێژەکەی. لە پانکەی بنمیچەکە خوارتری نەدەدی، لەبەر سەروقامەت و قاتە جنجڕەکەی، وەکو کەڵەشێری چینی دەهاتە بەرچاوم، دوو چەتەوڵی زرتەبۆزی زەبەلاحی لا قەپرغە ئەستووری سمێل داوداوی سەرو پۆتەلاّك ناقۆلاّشی بەدواوە بوو، دەتگوت چەترە فیلن، هەرچی گومانە لە چڕوچاویان دەباری، نیگایان دەتگوت تیرەو دەیەوێ کەللەسەری هەموومان شەقکا، نەوەك نیازی خرا پمان لەئاست جەنابیان لەمێشك دابێ. ئەوی بەرامبەرم، بەمامۆستا مامۆستا، لەجێوە دەرپەڕی و بە هەردوو دەستان خەریکی سەلام و ئیکلامێ بوو، جەنابیان نیوەی دەستی چەپی نووشتاندەوەو بەئاراستەی وی ئاماژەی

دووركەوتنەوەی پێكردن، سمێڵ خینگنەكەی دۆستم، لەوێ تاساو جورئەتی نەكرد یەك پێ پتر پێشكەوێ. ئێمە هەر یەكجاری قەدەممان شكا، فایلدارەكە فایلەكەی لێكەوتە سەر مێزەكەو نەوێرا دەستی بۆ بباتەوە، كابرای تیلمداریش، قوڕگی پێكوەنووسا، هەر ئەوەندەی بۆ كرا پەرداخە ئاوەكەی بەردەمی هەڵقوڕێنێ. منیش دەتگوت ئووتی كراوم رەق رەق دەقم گرتبوو. جەنابیان وەژووركەوت و دوو چەتەوڵەكەی دواوەشی لەبەردەرگا مانەوە. جارێ ئەو هەر بە تاق و دیواریدا دەڕوانی و دەیمنگاند:

ـ ئەوها نییە... بەس باوەبی!

بە پرتە پرت سوڕاوە ئەودیو مێزە پانوپۆڕەكەی، تەماشایەكی كورسیەكەی كرد، سەری باداو دوو نورچەی لێوە هات:

ـ نا.. نا دەزانم ئیش ئاوها نییە... بەس باوە بی.

كورسیەكەی داوەشاندو رنگ... لەسەررا خۆی بەرداوە ناوی.

ـ ئممم... ئێی... هێی، خۆ من دەزانم وا نابێ..

ئێمەش هیچمان لێهەڵنەدەكڕاند، دەممان داچەقیبوو و شەویلاگمان لەیەخەمان دەخشا. رووی لەئێمە كرد، نەماندەزانی تەماشای كاممان دەكا، یەك چارەگی رێك چاوی نەبزاوت، هەناسەیەكی هەڵكێشا...:

ـ یەعنی ئەوە ئاوهایە... باشە با وابێ.

تانم لەخۆمداو بەدەنگێكی لەرزیوەوە گوتم:

ـ بەڵێ مامۆستا؟!

ـ كورە كاكە مامۆستای چی، خۆمن دەزانم وەها نابێ، وەڵلاهی پێشمگوتن، بەوانیشم گوت ...هەر لەوێ بەزاری خۆم پێم گوتن... كاكە كە من دەچمە ئەوێ... ئاوها نابێ، بەلام وەڵلاهی خۆ ئەوان باشتر دەزانن ئاوها دەبێ یان نابێ، بۆیە ئەمن باش دەزانم ئەوها نابێ. باشە ئەگەر ئەوها نەبێ چۆن ئەوها دەبێ... وانیە جەماعەت.. ؟!

قسەزلەكەمان هێزی هێناوە بەرخۆی:

ـ مامۆستا، جەنابتان پێمان نالێن پلانی ئێوە چۆنەو ئێمە چبكەین باشە.

چ.. چ.. چ... من پێتان بڵێم، ئەگەر من پێتان بڵێم ئەدی بۆ پێم نەدەگوتن، باشە من بۆ پێتان بڵێم، ئەوەی بەئێوەی بڵێم.. جا بۆ پێتانی دەڵێم، بەخۆم بیكەم باشتر نییە...، هەر بەخۆم دەیكەم و ئێوەش تەماشامكەن، باشە ئەدی بەخۆتان چدەكەن... خۆمن دەزانم ئەو ئیشە ئەوها نابێ، بەلام لێگەڕێ باوابێ... لەوەی گەڕێن ،باشە پێم بڵێن ئێمە لێرە چایچیمان نییە؟!

فایلدارەكە وایزانی مێشی لەشانێ گرتووە، یەكپێ خۆی گەیاندە دەرگەو دوو زڕتە بۆزەكە لێی قیتبوونەوە، هەر زراوی رژا،

ـ كورە بابە چنەبووە، مامۆستا چایدەوێ

دوای ساتێك مام كانەبی بەخۆ بەچایەكی عەترلی هاتە ژوور، چایەكەی لەبەردەم مامۆستا داناو ویستی بڕوا، جەنابیان سیخەیەكی لێكردوو گوتی:

ـ وەرە.. وەرە.. وەرە، ئەوە چییە؟

ـ ئەوە چایە مامەستا..

ـ چ چایەك؟

ـ ئیٚ مامەستا چایەو ئەھ... چایەکی باشە، عەمموومان چەند ساڵە لەوەی دەخۆینەوە.

ـ من حەقم چییە بەعەمووتان. ھەر لەسەرەتاوە دەڵێم ئیش ئەوھا نابیٚ، وەرە پێم بڵیٚ بزانم.

ـ فەرمoو مامەستا.

ـ چەند جۆرە چا لەو بازاڕەی ھەیە بۆم بژمێرە.

مام کانەبی سەری لەبەرناو مڕ مڕ دامابوو، خەریك بوو بە تەسبیحە چڵکنەکەی حیسابی دەکرد. جەنابیان لێی مووڕ بۆوە.

ـ ئەوە چییە قل قل تەسبێحی ئاودیو دەکەی، کاکە ئیش ئەوھا نابیٚ... ئەگەر تۆ چایەچیەکی باشی یەکیەك ناویانم بۆ بڵیٚ.

مام کانەبی رەق راوەستا دەتگوت برووسك لێداوە... ھەندێك لاملی ھەڵکڕاندو گوتی:

بەکاکەی بلێم... چا گەلە زۆرە، ئەنواعی ھەیە، بەلان ھەر رۆژی نەوعەکی تازەی لیٚ دێتە بازاریٚ...

ـ کاکە ئیش کەینیٚ وایە دەبڵیٚ.. ناوەکانی بڵیٚ.

ـ مامەستا، چای عەلەم ھەیە، یەك عەلەم و دوو عەلەم، چای شەمیم ھەیە، چای پۆستاڵ ھەیە، چای ئەعمەد، چای مەعمود ، چای ئەحمەدی فەل، مەحمودی فەل، ئەحمەدی قۆدی، مەحمودی قۆدی، چای زەیتون، چای ھەیە سەفەری، ، چای سەیلان ھەیە ،چای ئەلکوزی و چای لیمۆو چای پرتەقال ھەیە، چای سێو ھەیە پێی دەڵێن، توففاعە، چای سێوی کەسك، سێوی پێنج کیلۆیی، سێوی سیٚ کیلۆیی، ، چای دلشا ھەیە چای ،دووغەزال ھەیە، ئەویش عەینەن قۆدی و کیسە، چای عوتوور، چا ھەیە بەتامی نەعناعی ھەیە بەتامی گوڵی ھەیە بەتامی خۆخی، ھەیە بەتامی پورتوقالی، ھەشە ھیچ تامی لێنایی، چا ھەیە بەفەردە دیٚ، ئەوان بەکیلۆ دەیفرۆشن،ھەیە بە کیلۆ دیٚ ئەوان بە فەردە دەیفرۆشن. ھەیە رەسمی قۆریەکی لەسەرە، ھەیە رەسمی پیاڵەکی، بەسەری توو مامەستا ھەیە کوو پەکی گەلەك جوانی لەگەڵدایە، ھەر لەدەست و پە نجەی جەنابت دەوەشیٚ، لەعەمووشی زیاتر چای بایعیە، ھەر دەڵێی خۆڵە پۆکە، وەڵلاٚ وەبزانم ھەر بن بێژینگەکەی تێدەکەن.

ـ باشە حاجی پێم بڵیٚ ئەتۆ چ چایەکی لێدەنێی؟!

ـ وەڵلاٚ مامەستا ئەوە نیوکیلۆ چای ئەعمەدم کڕیبوو، لەگەڵ یەك کیلۆ بایەعی تێکەڵم کرد، وکی وەسەریشم نا، ھەر جاری دوو سیٚ دەنکە ھێلی نازداری تێدەکەم، چایەك دەردەچیٚ ئەمان چا..

ـ ھەی لەو چایەی، لۆ بابە ئەمن خۆم لەدەشتیٚ دیتیتەوە، ئەتو چای بایعیت بۆ ھێناوم. ئەمن دەزانم ئیش ئەوھا نابیٚ، وادەزانی ئەمن گیام بەگوێیان خواردووە، مەدحی چای بایعیم بۆ دەکا. وەرە گوێم بدەریٚ، ئەگەر بەتەمای لەو دەزگەو دایەرەی من نانەکی بخۆی، دەبیٚ سیاسەتت بگۆڕی.

ـ مامەستا بەقوربانت بم سیاسەتی چی؟ ئەمن چایەچیمە ھەر سەرم لەسیاسەت و میاسەتی دەرناچیٚ.

ـ پیاو ئەگەر موسەققەف نەبوو، ئەوھایە، نازانیٚ ھەموو شتەك سیاسەتە، وەرە باتێتان بگەیەنم، گویٚ بدیٚ، ھەرچەند دەزانم ھەموو چایەکانی بازاڕت بۆ نەژماردم، بەلاٚم دەچی چای بایعیەکە نەبیٚ، ھەر چ جۆرە چای بازاڕی ھەیە لەھەمووی دەکڕی، جوان جوان تێکەڵی دەکەی، ھێل و عەترو دارچینیشی تێکەڵ دەکەی. کە جوان جوان ھەڵگێڕو وەرگێڕت کردن، لەو تێکەڵەیەی مشتێك.... نا.. نا.. نا مشتی چ بەو

دەستە لاستیقانەت، کەوچکەکی حەوت جاران بەجوانی دەشۆی و سێ کەوچکە چای دەکەیە چاپەستەکە. تا سێیەکی ئاوی تێدەکەی و پێنج خولەك لەسەر ئاگرەکی گەورەی دادەنێی، پاشان پازدە خولەك دەیخەیە سەر ئاگرەکی لاواز، کە لە بیست پلەی سەدی گەرمتر نەبێ، تا دێم بکێشێ، کەدێمی کێشا یەك چای وام بۆ دەهێنی. نەزۆر قورس نەزۆر سووك، نەزۆر خەست و نەزۆر ڕۆن، نەزۆر پەیت و نەزۆر شل، کە تەماشام کرد....

ـ مامەستا عەزیزم تەماشای چ دەکەی، ئەوە کوو لۆم دەردەینی، ئەمن لەکێ دەتانم ئەو هەموو چایەی بکڕم و تێکەلوپێکەلیکەم و ئەو چشتانە. بەهەزار حاڵ پارەی نیوکیلۆم دەدەنێ، بایعیەکەش لەماڵێ دەینم.

ـ چ... چ... چ، کێ ناتداتێ؟.

ـ مامەستا وەسلی ئەو نیوکیلۆیەشیان دەوێ دوایێ بەسەد دەردەسەری پارەکەم دەدەنەوە، زۆرجار ( 500 )دیناریشی لێدەبڕن.

ـ کێیە وادەکا؟

ـ مامەستا عەمووی لەدەست لوژنەی موشتەرەیاتە.

مودیرە فەندی بەو دەنگە زیقەی هەتا تێیدابوو قیژاندی لە هەنگییەوە زرنگە لەگوێی چەپم دێ، لاموایە ئەو قیژەیە پەردەی گوێی سمیبم.

ـ لوژنە... لوژنە... بڕۆن لیژنەی موشتەرەیاتم بۆ بانگکەن.

دۆستە کوسکێشەکەمان وەها دەرپەڕی، مام کانەبی پیلی نەگرتباوە بەسەر ورگی خۆیدا دەکەوت، جا ئەوی دەقەوما، دەقەوما. تا لیژنەی موشتەرەیات گەیشتن ،جەنابیان دەتگوت هێلکەی پێیە، ئارام و ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو، هەر بەژوورەکەدا جرت و فرتی بوو...:

ـ ئاخر ئیش ئەوها نابێ، چاك دەزانم ئەوها نابێ، بەس باشە باوابێ، خۆ ئەگەر ئەوهاش نەبێ وادەبێ. بەشەرەفم قەت قەت نابێ ئاوهابێ. بەلاّم باوابێ.

کە لیژنەی موشتەرەیات هاتن، ویستیان سەلام بکەن، جەنابیان فەرمووی:

ـ کاکە وەختی سەلام و کەلام نییە، ئیش ئەوها نابێ، پێم نالێن ئیش چۆن ئاوا دەبێ؟

سەرۆکی لیژنەکە لەگەڵ ئێمە دەتگوت ئاوقاتە قساندەکا، نازانم بۆ لە پێش جەنابیان دەتگوت شەپلە لێیداوە، لرخە لرخەکی لێوە هات و گوتی:

ـ جەنابی مامۆستا خێرە، بە چ سەخڵەت بووی.

ـ کاکە ئیش بەم شێوەیە نابێ دایەرەکی گەورەو گران و پارەکی زۆر، عەنتیکە نییە چای تێدا نەبێ.

ـ مامۆستا ئەدی ئەوە چا نییە لە پێشت؟!

ـ کوورە شەرمیش ناکەی، بەوەی دەڵێی چا. ئەوە چایە یا چەلاوی گۆریەی بۆگەنیە، ئەوە چایە یا دەرمان سیسرکەی کولاّوە، ئەوە چایە یا جیپڵقاوە، چا... چەند بەدەمی خۆشە کە دەڵێ چا...

تەماشای مام کانەبیت کردبا، سەری چوو بۆوە ناو قەلبی، زاتی نەدەکرد سەری بڵندکا، لەبن سمێڵە لاخوارە ڕەشکراوەکەشی پێکەنینی قوتدەداوە. بیستوپێنج ساڵە چایەچییە، بەحەیاتی وەسفی وا سەیری چای گوێ لێنەبووە. لەناکاو مرقەیەکی لێوەهات و دەرپەڕی. جەنابیان گوێی نەدا مام کانەبی و تەماشای

دەمی سەرۆك لیژنەی دەكرد، ئەندامانی لیژنـەش لە پـشتەوە دەتگـوت لـەتابووری عەسـكەری راوەسـتاون، هەریەكەیان تەماشای لایەكی دەكـرد، ئـەوی ناوەڕاسـت چـاوی لە پـشتملی سـەرۆك لیژنـە نەدەگوازتـەوە، دەتگوت لۆچەكانی دەژمێرێ، نەوەك چاوی بەچاوی جەنابیان بكـەوێ و پرسـیارێكی لێبكـا. سـەرۆك خـۆی هێناو برد:

ـ جەناب ئەمن ئەوە چەند ساڵە لیژنەی موشتەرەیاتم حەتتە ئێستە..

ـ ووسس، لێرە راوەستە، چەند ساڵە... بۆ بابە بەسـەرتدا تـاپۆكراوە، هـەر لێـرەوە كرپـە...دەزانم ئیش ئەوهانابێ، دەڵێن با ئەوها دەبێ، كورە بابە ئاخر وانابێ. هەر لەو ساتەوە بڕیارمـدا ئـەو لیژنەیـە هەڵوەشاوە، ئەمە میراتە یا لیژنەیە، كاكم چەند ساڵە لیژنەیە، چایەكی پێ چارەنەكراوە.

ـ ئاخر گەورەم...

ـ متەق نەكەی، هەر دەنگت لێوەبێ نەقلی.. كـورە فەسلێـشی، لیژنـە دەسـت لـە هینـان بـەرەو ژێـر بـە یەسیەم چوونە دەرێ. جەنابیان چاوی گێڕا مام كانەبی نەمابوو، ئەرێ ئەو چایەچیە چی لێهـات. دیـاربوو مام كانەبی هەر لە پـەنای دەرگـەی بـوو، وای زانـی هـەر زەمـانی عەسـكەرییە، هـات و زرم سـلاوێكی كـردو گوتی:

ـ بەڵێ گەورەم.

ـ عیلاجیان دەكەم، دەمزانی وەهانابی، بەلام لێگەرێ بـاوابێ. حـاجی ئـەوە لیژنـە فت، لیژنـەكی دی تەشكیل دەكەم ئەوجا بتبینم.

ـ گەورەم، لەجەنابتـان دەوەشێ وەڵلا ئەوتوو نیە... ئەتوو بابی لوژنەش فتدەكەی. چش دەڵێـی ئـەمن راوەستا یمە، چای عەرش و قورشت لۆ غـر دەكـەم، هێـل و عـەترو دارچـین و رازیانـەو كـەرەوزی تێدەكـەم، ئەوجا پیاڵەی عەننابیت لۆ لێوانلێو دەكەم و لە پێش مامەستای دادەنێم.

ـــ ئـەوە چ دەڵێـی كاكـە لێوانلێـوی چـی؟ بـۆ هـەروا فـشەیە چـا لێوانلێـوبێ. حـاجی وابـزانم ئـەتوش بەغەشیمم تێدەگەی و ئەخیری جێی خۆت لەقدەكەی.

ـ ئەدی چ بكەم مامەستا؟

ـ دەتەوێ جێت لەقكەی؟!

ـ نا.. نا دەڵێم ئەدی لێوانلێو نەكەم چ بكەم؟

جـەنابیان تـا ئێـستا بـە پێوەبوو، مـام كانـەبی درێـژو ئـەویش واقـوت وەرس ببـوو هێنـدەی ملـی پشتاوشكێنكاتەوەو قسان بكا، لەمێزەكەی وەرسوڕاوە دەستێكی بەلووتی داهێناو...:

ـ وەرە باتێتبگەیەنم...

دووجار ملی خۆی قرچاندەوە، مام كانـەبیش زۆری لـەخۆیرادیت، سینیەكەی لـەبن باخـەڵی نـاو چـوو لەسەر كورسیەكەی بەردەمی دانیشێ.

ـ ئەوە چییە... هەر ئەوە مابوو، هەستە بابە هەستە، باش گوێ بدێ. جارێ پێم بڵێ ئەو پیالانە چۆن دەشۆی.

ـ وەڵلا لەئاوی كولاوی دەنێم، تایتی لێدەدەم، ئەوجە بە ئیسفە نجێ یـەك یـەك دەشـۆم، دەدەمـە بـەر بەلووعەی حەتتە بریقەی دێ.

ـ تايت..!! بۆ تۆ فانیلەو دەرپێم بۆ دەشۆی تایتی لێدەی، دەچیە شێخەڵلای.. نا.. نا زەحمەت لەشێخەڵلای هەبێ، دەچیە سوپەرمارکێتەکی. دیتۆلی فەرەنسی هەیە لەو دیتۆلەی دەکڕی پێش ئەوەی هەرچایەکم بۆ بێنی سێ جار پیاڵەکەم بەو دیتۆلە دەشۆی، لەبیرنەکەی بەوودەستە چەرمە چقاڵتانەت بیشۆی... نا، دەستەوانەی نایلۆن هەیە، هی طوببیەکان. هەرجارەی یەکێکی تازە لەدەست دەکەی. نەك ئەو پیاڵە رەزا گرانانەش، پیاڵەی گوڵگوڵی بالاَ بەرزی ناو قەد باریك هەیە، ئەوانەی لای دواوەیان خڕو ئەستوورە، لەوانەم بۆ دەکڕی، کەوچکی تایبەتیش هەیە کە باریك و درێژو سەرپانن، ژێرەکەشی لەهەمان جۆر.

مام کانەبی لەبەرەخۆی گرژیەوە:

ـ بێوەدان.. وەڵلە نازانم مامەستا ژنی دەوێ یان پیاڵە..

ـ ئەوجا پاش ئەوەی حازرت کرد... ئەو چایەی باسمکرد لێتنا، بەهێواشی بۆم لە پیاڵەکە دەکەی.. بەس دەزانی چۆنی تێدەکەی؟

ـ بەلێ ئەدی کوو نازانم مالی بابت، لەکنتوایە فەننی تەییارەیە، شەکری تێدەکەم، چای لەسەر دەکەم و ئەوی ماوە پڕ ئاوی دەکەم..

ـ ئەی هاوار تۆ بۆ تێناگەی ئەدی لەسەرەتاوە نالێم باسی پڕو لێوانلێوو شتی وامەکە. من کاتی خۆی هەر لەبەر چایەك لەگەڵ دا پیرم تێکمدا. دەشزانم لێرە ئاوها نابێ، کاکە پیاڵەکەی دەکەیە پێنج بەش، پێنجیەکی شەکری تێدەکەی، ئەو شەکرە بۆنگرمخاو بۆرە نا، شەکری وردو سپی تایبەتی کە بەکیسە هەیە نەك بەفەردە. ئەوجا پێنجیەکی لەو چایە تێدەکەی کەوەسفم بۆ کردی. پاشان دوو لە پێنجی ئاوی تێدەکەی. لەبیرنەکەی... نەچی ئاوی فەلم بۆ بکولێنی ئاوی فەل ناخۆمەوە کاکە... دیارە دەتەوێ بمرم... دەتەوێ بمکوژی و لەناوم ببەی...دەلێم ئەوها نابی..

ـ ئەستەغفیروڵلاَ مامەستا چ حەددم هەیە، لۆ دەمەوێ بتکوژم، بەلان ئەمن زانیتم چیمەنتۆ فەل بی، ئاوی فەلم نەزانیە. تێشگەیشتم، ئەتوو دەتەوێ وکی چات لۆ دەینم پیاڵەکە چارێگەکی بەتال بی.

جەنابیان هەتا مست دەگری لەمێزەکەی گیرکرد.

ـ ئێستا تۆ بۆ تێناگەی، ئەو پیاڵەیەم بدێ، بەس ئەو پیاڵە دەستنادا. بڕۆ پیاڵەکم بۆ پەیاکە لەوانەی پێمگوتی..

کیژۆڵەیەکی جاحێڵۆکە هەبوو، تازە لامان دامەزرابوو. دەتگوت فیسقەگولەیە، بەلاَم هێندە لەخۆی رازیبوو، دەتگوت خزمی جەنابیانە، هەر رۆژی پرچی بەمۆدەیەك هەڵدەپاچی، کامە جلوبەرگی تەسك و تریسکە لەبەری دەکردن، تیشێرتەکانی زۆر ئالۆوالاَبوون، هەر کامەی دەپۆشی چەند وشەیەکیان لەسەر نووسرابوو، ئەو بەستەزمانە نەیدەزانی، بەلاَم بڕوا بکەن، نووسینی وات لەسەر دەخوێندەوە، هەر ئارەقەت لێ دەتکا، کەچی خاتوون خۆی پێبادەدان. ئەوە سەرباری هێماو دروشم و هێلکارییەکانیش. جا ئەو کیژۆڵەیە هەر بۆ ئەوەی خۆی جوودا نیشانبدا، پیاڵەیەکی لەو بابەتانەی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە جەنابیان وەسفی دەکرد، هەموو جارێ کەحەزی دەچووێ حەرەمی چاخانەی مام کانەبی دەبەزاندو بەبێ مەرحەبا دەچووە بەر سەماوەرەکەو لەگەڵ خۆبادان و نووزەو ئۆخژن بەدەست ئاوی گەرمەوە ، چایەکی بۆ

خۆی تێدەکردو تیچاوەکی دەداوە مام کانەبی و تیتکی لاچاوی هەڵدەداوەو، بەقەستی نەرمە کۆخەیەکی بۆ دەکردو بەخۆبادان دەگەڕاوە شوێنی خۆی و مژی وا عەجایەبی لێدەدا، تا دەرکەویٚ چەند تامەزرۆیە.

پێش ئەوەی مام کانەبی بچێتە مارکێتەکەی ئەوبەر سۆراخی پیاڵەیەك بۆ جەنابیان بکا. ئەو کچەی بەبیرهاتەوەو هەڵیکوتا سەریی.

ـ خاتوون عەیب نەبێت مامەستا ئیشتی پێیە.

ـ ویش مامە... مامۆستا کێیە؟!

ـ جەنابیان.. مدیری تازە..

ـ کیژە رەنگی بووە پەلکە پیاز، خێرە مام عاجی؟ چنیە نا کیژم عەزی لەیەکەکی وەکی ئی تووە.

ـ تێناگەم...!!!

ـ دەلێم داڵغەی لە پیاڵەکی وکی ئەوی تو دایە، دەعوا دەکا تا بپیوی چەندی چالۆ تێبکەم.

ـ ویش ئەو پیرەمێردانە چەند بێخێرن..! گوتم.. داخوا..! دەست بۆ هەر شتێك ببەن خێری دەبڕن... ها بگرە.. ها، دوایی دێم بەخۆم دەیهێنمەوەو چایەکەشم دەخۆمەوە!

مام کانەبی وەکو با دەست بە پیاڵەوە گەڕاوە ژووری جەنابیان ئێمەش، هەروا بیٚ نقەو جقە کڕ کەوتووین.

ـ ئەوەی دەلێی گەورەم.

جەنابیان، تەماشای کرد هەرچی ماسولکەی چرچاوی هەیە بەجوڵەکەوتن

ـ ئیع.. بۆ وا پیسە، دەڵێی میشکی تێدا رەوەلاوە. بەس چی بکەین.. وەها نابی... بەس چار چیە باوابی، دەبڕۆ مەستەرەیەك بێنە باتێتبگەیەنم.

مام کانەبی هەر تێنەگەیشت مەبەستی چییە. وایزانی گاڵتەی پێدەکا، خۆی لە گێلی دا، خەریك بوو بەنینۆکی چلکی سێنیەکەی دەستی هەڵدەخراند، منیش پێم فورسەت بوو تۆزیٚ پانکەمەوە، بە پەلە چوومە ژووری ئەندازەی دەزگاکەمان و مەستەرەیەکی کانزایی چاکم هێناو بەئیکلامەوە..

ـ فەرموو مامۆستا ئەمەش مەستەرە.

بە نابەدڵی لێیوەرگرتم و بەتەوسەوە گوتی:

ـ مەستەرەی شەفاف قاتی بووە چی بۆ هێناوم.

وەرە مام حاجی وەرە،

ـ ئەو پیاڵەیە...

راوەستە جاریٚ مەیدە دەستم...دەستەسرێکی هەڵگرت و پیاڵەکەی پێوەرگرت..

ـ ئەو پیاڵەیە... مەستەرەکەی لە پالیٚ راگرت بەرزیەکەی 11 سانتیمەترە. بنەخڕوخۆڵەکەی فتکەین 10سم دەمێنێتەوە کە دەکاتە 100 ملم...تێگەیشتی.

ـ بەڵیٚ بەڵیٚ ئیشاڵلا تێدەگەم. بەلان وەڵلاهی بمزانیبا لەئەوەلی خەیاتیم بکردبا باشتر بوو.

جەنابیان فایلدارەکەی بانگ کردو گوتی:

ـ بنووسە، چی دەڵێم بۆی بنووسەو پاشان پێی لەبەرکە. ئەوە دەبێتە ئیشی لەمەودوات... بنووسە بەرزی پیاڵەکە 10سانتیمە، کەدەکاتە 100ملم، 2سانتیم شەکری تێدەکەی، 2سانتیم چای تێدەکەی و 4سانتیم ئاوی تێدەکەی و2 سانتیمیش لەسەرەوە بەبەتاڵی بەجێدێڵی، تۆ تێگەیشتی.

ـ بەڵی جەناب من تێگەیشتم، خاترجەمبە پاشانیش مام کانەبی تەعلیم دەدەم و چۆنت حەز لێیە بەدڵی تۆ دەبێ.

ئەوی پەڕگەی کە فایلدارەکە بوو، یەکێکی خینگەی هورگەستووری بێملبوو، دیاربوو دەمێك بوو ئۆقرەی لێ بڕابوو، وەزعی تێکچووبوو، هەر قوونەگۆزی بوو، نەدەحەواوە، کورسیەکەی ئەویش لەهەمووان پتر لەجەنابیان نێزیك بوو، وەختێك قۆڕەیەکی وای لەزگیەوە هات دەتگوت کەرەنایە، بەستەزمان لەتاوان سوورهەڵگەڕا، بەهەردوو دەستان ئارەقەی دەسڕیەوە، مام کانەبی گوتی:

ـ هەی لەبابی منت کەوێ، عافەرم تەییارە شکێنە تەییارە شکێن.

جەنابیان ترش داهات، خۆی گرتبوو نەکو بڕشێتەوە... وایلێهات خۆی دەربازکا ،تەماشای سەعاتە زلەکەی بەرامبەری کردو گوتی:

ـ جەماعەت دەوامیش خەلاس دیارە وا سەعات سێیە. خۆ دەزانم ئیش ئەوها نابی، بەس قەیناکە باوابێ.

هەستاوە بڕوا، بەبێزەوە لچولێوی لە ورگنە فایلدارەکە باداو، گوتی:

ـ ئەوە پێتان دەڵێم، لەبیر نەکەن، مادام ئەمن هاتمە ئێرە، ئیش قەت ئاوهانابی، بەس کورە باوەبی، ئەوجا ئەمن دەزانم وادەبێ یاوانابێ. پێشمگوتن وەنابێ...بەلاّم چبکەم باوەبێ.

لەگەڵ هاتنی جەنابیان گەورەترین گۆڕانکاری روویدا، لیژنەی موشتەرەیات وەکو خۆی ماوە، بەلاّم خزمەکی خۆی بووە سەرۆك لیژنەو کاروبارەکان رۆژ لە رۆژ زیاتر روو لە شلین، ، هەرچەند دەزانم واش نابێ، بەلاّم گەورەترین گۆڕانکاری روویدا، هەرکاتێك سەر بە چایخانەکەی مام کانەبیدا بگری، نەك هەر مەستەرە، بەڵکو پرگاڵ و گۆشە پێوو سکوێریشی لەسەر مێزەکەی بەردەمی داناوەو تەرازوویەکی مسقاڵکێشی لەبەردەمە لەگەڵ یەك دنیا قۆدی و کیسەی چای جودا جوداو، دوو دەسکێشی نایلۆنی لە دەستەو بەکێشان و پێوان چا لێدەنێ و تێیدەکا ،چاك فێربووە چواریەك و پێنجیەك چین و چۆن دە پێورێن ،ئەلحەق چایەکەشی نەوەکو چا بۆن عەترو هێلەکەی پێشان... تام قوزژەڵقورتی لێدی. جەنابیان گەورەترین پێشکەوتنی ئە نجامداوە. لەبەر ئەوەی ئیشیش وانابێ، لێگەڕێ... دەبا وابێ.

2008/5/7